# مەجلس أولیاء

نوسینی: جوامێر کوردی

ئیمامی ئەبوحەنەفی

ئیمامی مالیک

ئیمامی ئەحمەد

ئیمامی شافعی

PDF
28
لا پەڕە

بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد ألا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله صلى الله وسلم عليه وعلى آله وصحبه أجمعين، أما بعد:

## پێشەکی

سەرەتاداواکارم لە الله ﷻ ئەم نوسینەمان بکاتە تێشوی قیامەت وەنیەتمان پاک کاتەوەلەڕیا ئیمان داران خوێندنەوەی ژیانی پێغەمبەر(**محمد**ﷺ)تابەجوانی زۆر گرنەگە موسوڵمان وە تێگەیشتن لێی بۆچی بۆدامەزراندنی عەقیدە وە بۆچۆنێتی هەڵسوکەوتوکردن لە کاروباری ڕۆژانەمان وە پاشان فێری سەبەبی دابەزاندنی ئایەتەکان ببین تابتوانین حوکمیان پێ بکەین چونکە حاڵەتەکان جیاوازە نابێت بە فکری خۆمان بەکاریان بهێنین دواتر شارەزابون لەژیانی صەحابە بەڕێزەکان بەتای بەتی چوار صەحابە بەڕێزەکە وە دوای ئەوەش شارەزابون لە ژیانی ئیمام و تابعینە بەڕێزەکان زەرورە بۆئەوەی تێبگەی کە ئەم دینە چۆن بەئێمەگەیشتوە بۆیە نوسینی ئەم کتێبەم بۆشارەزابونە لە ئیمامە بەڕێزەکان تێگەیشتنێکی پوخت لە هەندێك گێڕانەوە تابەشی ئەوە بزانێن کە جاهیلێکی نەفام هات قسەی پێوتن بزانین پلەو پایەی ئەم ئیمامە بەڕێزانە چەنێکە تا شارەزابین دەستەوەستان نەبین ئیمانداران ئەم ئیمامە بەڕێزانە بەخوێندنەوە گەشتنەئەم پلەی ئێستاباس ئکرێن وەک هەریەکێکیان زۆرترین حەدیسیان لەبەر بوە کەئێستالای ئێمە قەناعەت پێنەکراوە ئێمە ناتوانین کتێبێکی ٣٠لاپەڕەی بخوێنین کە لەکاتێکدا ئیمامی شافعی حافض قورئان ئەبێت وە

کتێبی موطای ئیمامی مالکی لەبەردەبێت بەکاملی لە تەمەنێکی گەنجیداکە نزیکی ۳۰۰۰هەزار حەدیس بەس لەوکتێبەدایە چەندین ئەحکامی گرنگ جابابیرکەینەوە ئەم ئیمامە بەڕێزانە بەو عیلمە مەزنە ئاخر چۆن گوێ لەکەسێک گرین کە ۵۰پەڕەی لە قورئان لەبەر نیە یان ناش زانێت بیخوێنێتەوە ئەمە چ عەقڵێکە بەڕاستی جێ داخە ئومەتی( **محمد**ﷺ) ئاوا خۆش باوەڕ بن یان ئەوەشی کە قەناعەتی بەم شوبهە نەکردوە بەڵێ خۆی بیستویەتی ئەزانی ئیمامەکان بەڕێزن بڵام هێشتانەئەم جۆرەکەسەش نەقسی تیایە نەقسەکەی ئەوەیە ئەم دینە ئەرکی گەیاندنی لەسە رشانی هەمو ئیماندارێکە لەکاتێکدا ئیمامەکان گیانی خۆیان بەخشی وە لەپێناو ئەم دینە وەک ایمام ئەحمەد  بڵام ئێستابڕوادار توانای نیەناملیکەیەکی ۳۰لاپەڕەی بخوێنێتەوە براکەم بەخوێندوەی ئەم کتێبانە خۆتیش پڕ عیلمەکەیت وە شمشێرێکی باشی ئەبێت بۆ زمان بڕینی زمان درێژان

لەئاخیری پەیامەکەم داواکارم ئەم نوسینە ببیتە شمشێرێکی تیژ بۆزمان بڕینی ئەو جاهیلانەی کە صواڵی بەهاوڵاتی بونی ئەوروپائەکەن بڵام دانیشتون قسەبە ئیمامە بەڕێزەکان ئەڵێن یان کەسانێك کە  دڵیان نەخۆشە کرمی هەڵ هێناوە لەدڵیا قسە بەئیمامێك ئەڵێت بەڕاستی نازانێت بڵام بە زمان ئەڵێت من هیچی لەسەر ناڵێم بۆمن نیە بۆت نیە  بەڵێ قسەبە ئیمامێك بڵێت لەخزمەت صەحابەی بەڕێزدابوە بۆتۆنیە بەڵێ ناوێریت لەبەردەم بچوکترین وە لاوازترین جوندی طاغوت باسی عەقیدەی خۆت بکەیت بڵام ئیمامێکی وەک ابوحەنەفی لەسەر ئەوەی گوێ بۆ خەلیفەیەك نەگرت کە لایدابولەشەرع خستیانە سجن لەسجنا گیانی لەدەستدا .رحمة الله

**ئیمامی ئەبوحەنەفی { رحمە اللە }**

لێرەباس لە ئیمامی أبوحەنفی {رحمە اللە }دەکەین دەچینە کۆڕومەجلیسی یەکێک لەتابیعینی ئوممەتی پێغەمبەر(ﷺ)لەئاسمانی دیندامانگی شەوی چواردەبوولەزانینی شەریعەت و ئایندا ئیمامی ئەعظەم بو دەرون ناس و دەریایەك پڕلەعیلم بو بیرتیژێکی لێزان بو تێگە یشتو لەقورئان بوو ،لەلایەکی تر سەرقافڵەی بازرگانی،لەئاسمانی عێراقدا ئەستێرە یە کی پڕشە نگ گویٚ بگرین بۆباسی ژیانی ئەم ئیمامە بەڕێزە.

ئیمامی حەنەفی کەمەشهورەبەئیمامی ئەعزەم ناوی (نوعمان)ی کوڕی(سابیتە)ولەئەسڵداخەڵکی شاری کۆفەیەودەڵێن:لەشاری ئەنبارلەدایک بووە لەساڵی هەشتای کۆچیدا. چاوی بەزۆرلەهاوە ڵانی پێغەمبەر و زاناوعولەما کەوتوە،وەك (ئەنەسی کوڕی مالیك،جابری کوڕی عبداللە،عبداللەی کوڕی ئەبی ئەوفاو،عبداللەی زەعبەری و مەعقەلی کوڕی بەسیار و زۆ تریش)هەروەهازۆربەخزمەت ئیمام جەعفەری صادق گەیشتوە مامۆستای دەرسی فوضەیلی کوڕی عیاض ئیبراهیمی ئەدهەمی بیشری حافی و داودی تائی ئەبوو یوسف و ئیمام محمد بوە.

ئیمامی حەنەفی دەفەرمویٚ:دوای ئەوەی ماوەیەك خوێندم وام ئەزانی هەموشت ئەزانم ، تاسەفەرێك چومە بەصرە زۆر پرسیاریان لیٚ کردم نەمزانی وەڵامیان بدەمەوە. فەرموی بیستوپێنج ساڵی تر لە خزمەت حومادی کوڕی زەید مامەوە بۆفێربونی عیلم.

کاتێک بەتەواوی خوێندنی تەواو کردوە هاتۆتە بەغداد دەستی کردوە بەکاروکاسپی تاشەوێک لەخەویدادەچێتە سەر قەبری پێغەمبەر**محمد**(ﷺ)هەڵدەداتەوەو جەنازەی موبارەکی دێنێتە دەرێ لەترسان لەخەوەکەڕادەپەڕێت خەوی لێ ناکەوێتەوە،بەیانی دەرواودەچێت ابن سیرین دەدۆزێتەوە خەونەکەی بۆدەگێڕێتەوەدەفەرموێت بچۆتەدریس بکە خەونەکەت مەعنای وەیە شەرع و حەدیس پێغەمبەر(ﷺ)زیندودەکەیتەوە،ئینجادەستی کردبەتەدریس و ئاخری بوو بەیەکێك لەسەرمەذهەب و موجتەهیدگەورەکان و تەرەقی بەدینی ئیسلام دا.

زیرەکی و زانایی بەدەرەجەیەکی وابوە جارێک ئافرەتێك لەمزگەوت دەچێ بۆپرسیارێکی شەرعی ، لەوکاتەدا؟ئیمامی حە نەفی جەندکەسێکی لەخزمەتدادەبێت ئافرەتەکەسێوێك ئەدات بەئیمامی حەنەفی لایەکی سور ئەبێت لایەکی زەرد ئیمامی حەنەفی بێدەنگ سێوەکە لەت دەکاتودەی داتەوە بەئافرەتەکە ئافرەتەکەش بێدەنگ خواحافیزی ئەکات وە ئەڕوات خەڵکەکە زۆریان لاسەیردەبێت ئەڵێن قوربان ئەمە چیبو؟دەفەرموێت ئەو ئافرەتە کەوتۆتە حەیزەوە جاری واهەیە خوێنەی سورە جاری واهەیە خوێنەکەی زەردە هات پرسیاری کرد ئاخۆ کامیان خوێنی حەیزە ؟منیش سێوەکەم بۆلەت کرد دامەوە مەعنای وایە تاوەکو ناوەڕاستی ئەو سێوە پاك وسپی نەبێتەوە هەر لەحەیزدای ئافرەتەکەحاڵی بو ڕۆیشت ،هەروەهاڕۆژێک لەمزگەوت دەبێت کۆمەڵێك لەوانەی پێیان دەوت خەواریج دەست بەشمشێرەوە دەچنە سەریو دەڵێن ئەی ئەبوحەنەفی دوپرسیارت لێ دەکەین ئەگەر زانیت ئەوانەجاتت ئەبێت دەنادەت کوژین فەرمووی بڵێن بزانم دەڵێن چی؟ وتیان دوو جەنازەیان هێنابۆهەیوانی مزگەوت یەکێ کیان پیاولەکاتی مەستی دا مردوە ئەوی تریشیان ئافرەتێکە زینای کردوە حامیلەیە ئەو ژن و پیاوە بەکافری مردون ؟یان بەموسوڵمانی؟ ئەو کۆمەڵەش لایان وابو ئینسان بەگوناحێك کافرئەبێت جابزانە ئیمامی ئەبو

حەنەفی چۆن خۆی ڕزگارکرد فەرمووی ئەو ژن و پیاوە جولەکەبون ؟گوتیان نەخێر فەرمووی گاوربون؟ گوتیان نەخێرفەرموی ئاگرپەرست بون؟گوتیان نەخێرفەرموی ئەی بت پەرست بون ؟ گوتیان نەخێرفەرموی ئەی باشە لە چ تاقمێك بون ؟گوتیان موسوڵمان بون گوتیان جائەوە خۆتان وەڵامی خۆتان دایەوە گوتیان چۆن فەرمووی ئێوەناڵێن موسوڵمان بون وتیان باشە بەهەشتین یان جەهەنەمی ؟ فەرمووی پێغەمبەر دەرهەق بەخراپتر لەوان چی فەرمووە منیش وادەڵێم گوتیان چی فەرموو؟ گوتی ئەوەنیە(الله ﷻ )لەسورەتی ئیبراهیم دەفەرمێت﴿فَمَن تَبِعَنِى فَإِنَّهُ مِنِّى وَمَنْ عَصَانِى فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾

(سوڕەتی إبراهيم:٣٦)

ئەوەی بەدوای من کەوت ئەوە وەك من وایە و لەمنە بەڵام ئەوەی بێ ئەمری منی کردئەوەکەیفی خۆیە تی تۆبۆخۆت لێخۆش بو مهیرەبانی.

دەفەرمویێت ئەوانەی چوبون تاقی بکەنەوە بی کوژن تۆبەیان کرد لەخزمەتیافێری عیلم بون کەزانیان وا داناوزانایە.

ئیمامی حەنەفی زۆر هەق بێژ بوە شەرمی لەهیچ کەس نەکردوە دەڵێن خەلیفە بەغداأبوجەعفەری مەنسوری بڕیاری دا کەهەر زانایەك پارچە ئەرزێکی لەسەر تاپۆبکەن تابیکابەخانووفەتواونامەدەنوسێت دەینێرێت بۆلای زانابەرزەکان ئیمزای بکەن وەفتوای لەسەر بدەن لەپێشدابردیان بۆلای قازی بەغداد کەتەماشای کرد ئیمزای خەلیفەی پێوەبو ئیمزای کردئینجابردیان بۆلای ئیمامی حەنەفی فەرمی تاخەلیفە نەبینیم من ئیمزای ناکەم پیاوی خەلیفە توڕەبو وتی قازی بەغداد ئیمزای دەکات تۆ ئیمزای ناکەیت چوەوە خەبەری دابە خەلیفە خەلیفە تورەبو وتی بچن قازیم بۆبانگ بکەن،قازیان هێنابۆلای خەلیفە وتی جەنابی قازی لەشاهیدیدا

چاوپێکەوتن شەرتە؟ وتی بەڵێ خەلیفە لەقازی توڕەبو گوتی باشە ئەی گەر چاوپێکەوتن شەرتە بۆچی لەپێش ئەوەیدا چاوت بەمن بکەوێت ئیمزات کرد؟ ئاخر

بەئەمری تۆیە نەم توانی داوای جەنابت بکەم خەلیفە گوتی کەواتە أبوحەنیفە ڕاست ئەکات بڵام قازی لەبەر ئەوەی شەرمی حزوری کردوە ئەوا لەقازیم خست.

خەلیفە گوتی ئیمامی حەنەفی سوفیانی ثەوری شوریح وموسعەری کوڕی حەڕامم بۆبانگ بکەن چون کۆیان کردەوە هێنایان بۆلای خەلیفە. لەڕێگادا ئەبوحەنەفی فەرمووی کوڕینە من دەزانم بۆچیان بانگ کردوین وە چیوچیمان بەسەر دێت گوتیان چۆن؟ فەرمووی خەلیفە داوامان لێ دەکات ببین بەقازی من بەفێڵێك خۆم ڕزگار ئەکەم سوفیانی ثەوری ڕادەکات خۆی دەشارێتەوە مەسعەت لەترسان خۆی شێت ئەکات بەڵام شورەیح دەبێتە قازی قسەکەی ئەبوحەنیفەیان زۆر لاسەیر بو زۆر نەڕۆشتین سوفیانی ثەوری ڕای کرد خۆی شاردەوە ئەوانی تر چونە لای خەلیفە خەلیفە ڕووی کردە ئیمامی حەنەفی و گووتی دەبێت ببیتە قازی فەرمووی ئەی جەنابی خەلیفە خۆت ئەزانی من لەئەصلدا عەرە ب نیم وەگەورە پیاوانی عەرەب بەفتوای حوکمی من ڕازی نابن خە لیفە گوتی قەزاوات پیاوی زانای دەوێت عەرەب بێت یان عەرەب نەبێت فەرقی نیە ئیمامی حەنەفی فەرموی ئاخر قوربان من لایەقی قەزاوات نیم جائەگەر لەوەداڕاست ئەکەم دیارە بۆقازی نابم جادرۆش بکەم جەنابت نابێت ڕازی بیت درۆزنێك ببێتە قازی ئەبو حەنیفە ڕزگاری بو لەوکاتەدا مسعەر چوبەردەم خەلیفەو دەستی کردو ڕای وەشاندو وتی ئەرێ قوربان چۆنیت باشیت ماڵو مناڵ چۆنە خەلیفە بەسەر سامیەوە تەماشای مەسعەری کرد وای زانی شێتە وتی وەرن ئەم شێتە لەکۆڵ من کەنەوە ئەویش ڕزگاری بو لەپاشان شورەیحیان کردە قازی

## هەنێك لە ئادابی ئیمامی حەنیفە

شێخ داوودی طائی دەفەرموێت بیست ساڵ لەخزمەت ئیمامی حەنەفیدابووم قەت نەمدی جارێک سەر ڕوت کاو قەت نەم دی جارێک پێ ڕاکێشێت .دەفەرموێت ڕۆژێك عەرزم کرد قوربان چ دەبێت ئەگەر بۆحەسانەوە تۆزیك پێ ڕاکێشیت؟ فەرمووی ئەی داودی ئینسان دەبێت لەخەڵوەتیشدا شەرم لە اللهﷻ بکات ئەدەبی هەبێت.

ڕۆژێک چەند کەسێک لەخزمەتی دا دە بن بەڕێگایەکدا ئەڕۆن تەماشە دەکەن منداڵێک لەقوڕ چەقیوە قوڕاوی بوە دەفەرموێت ڕۆڵەئاگات لەخۆت بێت نەکەویت منداڵەکە سەر بەرز دەکاتەوەو دەزانێت کە ئەوە ئیمامی حەنەفیە دەڵێت ئە ی ئیمامی موسوڵمانان کەوتنی من شتێکی ئاسانە ئەگەر بش کەوم گورجێگ ڕاست دەبمەوە بەڵام تۆ وشیاربە نەکەویت و لە حەق لانەیت چونکە ئەگەر تۆلابدەیت هەڵەخلیسکێت تەواو ئەو موصوڵمانانەی وادوای تۆکەوتون دەکەون ڕاست کردنەوەیان زەحمەتە ئیمامی حەنەفی قسەی منداڵەکەی زۆرلابەنرخ بوو دەستی کرد بەگریان روی کردە خەڵکەکە ووتی دەخیلە ئەگەر بەڵگەو دەلیلێکتان دەست کەوت دەلالەتی دەکرد لەسەربەتاڵی فتوای من بەقسەی من مەکەن. ئیمامی حەنەفی عەقڵ و فەراسەت و زەکاوەتیکی زۆر غەریبی بو زۆر بەی خەڵکی بە عەقڵ وقیاس و بێدەنگ کردون وەڵامی داونەوە دەڵێن کابرایەک زۆر حەزرەتی عوسمانی ڕق لێبوە جنێوی پێداوە وە بەجولەکەوخائینی ناودەبردئیمامی حەنەفی خەبەری دەزانێت دەنێرێت بەدوایدا کابرادێتە خزمەتی دوای بەخێراتنی دەفەرموێت دەزانیت بۆچی بەدوامدانارد‌ی کابرادەڵێت قوربان نازانم ئەویش

دەڵێت خەبەرم زانیوە کچێکی باشت هەیە داوات لێدەکەم بیدەیت بەفڵان جولەکە ؟کابرازۆری لاسەیردەبێت دەڵێ جاقوربان جەنابت ئێستائیمامی موسوڵمانانی فەتوادەدەیت کەکچێکی موصوڵمان بدرێت بەجولەکەیەکی خائین کابراوتی قوربان ئەگەر جەنابیشت فتوابدەیت من هەر نایدەمێ پاشان خەلیفە فەرموی باشە تۆ کە یەکێکیت لە ئۆمەتی پێغەمبەرﷺ ڕازی نابیت کچەکەت بدەیت بە جولەکەیەکی چونکە خائینە کەواتە چۆن بەڕەوای ئەزانیت پێغەمبەر(ﷺ)دووکچی خۆی بدات بەکەسێکی خاین جولەکە . کابراکەئەوەی لەئیمامی حەنەفی بیست زانی مەبەستی چیە پەشیمان بویەوە تۆبەی کرد بڕیاری دا جارێکی تر باسی ئیمامی عوسمان نەکات

ئیمامی ئەبوحەنەفی لەقسەو فتوادا زۆر وردبوە ڕۆژێک بەڕێگادا دەڕوات چەند دڵۆپە قوڕاوێکی بەجلەکانیدا دەپرژێت دەچێت دەیشواتەوە پاکی دەکاتەوە دەڵێن قوربان جەنابت فەتوات داوە هەنێك پیسی کەم بەر لیباس بکەوێت عەفوە کێشەی نیە کەچی بۆخۆت ئەو نەختە قوڕەت شتەوە ئەوە مانای چیە؟

فەرموی ئاخرئێوەنازانن کەفتواو تەقوالێك جیایە ئەوەی ئێوەدەیڵێن ئەوە فەتوابو بەڵام ئەم شتنەوەی من تەقوایە . فەرمووی نابینن کە پێغەمبەر(ﷺ)ڕێگەی بیلالی حەبەشی نەداکەزەخیرەی زستان داکات بەڵام بۆحەرەمەکانی خۆی قوتی ماوەیەکی دانا. عیلم و ئەدەب و تەقوای ئیمام حەنەفی لە باسکردن نایەت لەگەڵ ئەوەشدا بازرگانی دەکرد وەقازانجەکەی دەبەخشەیەوە بەتایبەتی عەباوکەواوصەڵتەی زۆربەی ملاوفەقیەکان لەسەر ئەو بو دەشی فەرموو ماڵی الله ﷻ هیچ منەتی تیانیە هەروەهادەڵێن عادەتی وابوە هەرکەسێك لەلای دابنیشتایە پرسیاری لێ دەکرد داخۆ ژیانی چۆنە؟ئەگەردەست کورت بوایە دەستی دەگرتەوەڕۆژێك پیاوێکی لیباس چڵکن دەچێتە خزمەتی بەینێك دادەنیشێت لەپاشان کەخەڵک هەڵ دەستێت ئەویش خەریک دەبێت بڕوات ئیمامی حەنەفی دەفەرموێت جارێ دانیشە

کابرادادەنیشێت تاچۆڵ دەبێت لەپاشان ئیمام دەفەرمویێت: ئەویا هەڵ دەوە هەزار درهەمی تێدایە بۆخۆت خەرجی کە کابرادەفەرمویێت قوربان فەقیرنیم ئیمام یش پێ دەفەرمویێت دەی باشە ئەو حەدیسەی پێغەمبەر(ﷺ)نەبیستوە الله زۆری پێخۆشە ئەسەری نازو نیعمەتی خۆی بەبە ندە کانیە وە ببینێت کەچویتەوە خۆت بگۆڕە لیباسی تازە لەبەر بکە

ئیمامی ئەبوحەنەفی ترسی لەکەس نەبوە لە دەعوەکەیدا لە اللهﷻ نەبێت لەهیچ کەس نەترساوە زۆر جار لەلایەن خەلیفەکانی بەغداوە گیراوە تاجاری ئاخیری ئەبوجەعفەری مەنصوری دوبارە ناردی بەدوایدا کەبینی بەقازی فەرموو بەخەلیفە بڵێن قەزاوات ناکەم چون بەخەلیفەیان گوت بۆشتێکی وادەڵێت خەلیفە سوێندی خوارد وتی هەر دەبێت بیکات چون بەئیمامیان وت خەلیفە سوێندی خواردوە هەردەبێت بیکەیت قەزاوات پاشان ئیمام سوێندی خوارد وتی نایکەم وتیان باشە خەلیفەش سوێندی خواردوە وتی ئەو باشتر کەفالەتی سوێندی پێدەدرێت جالەودوا خەلیفە ئەمری کرد بیگرن سجنی کەن وە ئیمامی بەڕێز ئەبو حەنیفە لەسجن وەفاتی فەرموو لەساڵی ١٥٠کۆچی {رحمه الله }

پوختەی باسەکە وە قسەی پێشەوایانی ئومەت لەسەر ئەم ئیمامە بەڕێزە

پێشەوا أبو حنيفة - رحمه الله - (٨٠-١٥٠ هـ)

**شوبهەی_یەکەم قسەی زانایان لەسەر أبو حنيفة رحمه الله:**

ئیمامی أحمد_کوڕی_حنبل رحمه الله (١٦٤-٢٤١ هـ)

ئەگەر لێدانی أبو حنيفةیان بۆ باس بکردایە وە دوورکەوتنەوەی لە دادگای (قضاء) لە کاتی میحنەت ، بۆی دەگریا وە ڕەحمەتی لەسەر دەکرد.«

]طبقات الشافعية الكبرىٰ للعثماني ا لاپەڕە ٢٣٥[

الإمام_الخريبي - رحمه الله - (١٢٦-٢٢٣ هـ) دەفەرمووێت :

»هیچ کەسێك قسە بە أبو حنيفة ناڵێت ئیلّا کەسیکی حەسود یان جاهیل.«

]سير أعلام النبلاء الذهبي ا

ئیمامی_الكشميري رحمه الله دەفەرمووێت :

»يحيى_کوڕی_سعيد_القطان (١٢٠-١٩٨ هـ) ئیمامی جەرح و تەعدیل یەکەم کەس بوو لەم بابەتە نویسیویەتەوە ، الذهبي وای ووتوە .

وە فەتوای دەدا بەمەذهەبی أبو حنيفة رحمه الله ، وە قوتابیەکانی وکیع کوڕی الجراح قوتابی الثوري بوو ، ئەویش حەنەفیە .

وە يحيى کوڕی معين رحمه الله (١٥٨-٢٣٣هـ) نەقلی کردوە کە يحيى کوڕی القطان پرسیاری لێکرا دەربارەی أبو حنيفة رحمه الله فەرمووی : « هیچ ڕەئیمان باشتر نەبینیوە لە ڕەئی ابو حنیفة.«

وە إبن المعين هەروەها نەقلی کردوە: «إني لم أسمع أحداً يجرح أبا حنيفة رحمه الله تعالى» واتە: من گوێ بیستی هیچ کەسێك نەبوومەقسەبەأبوحنیفةبڵێ رحمه الله تعالى...«

تا زەمانی یحیی کوڕی سعید القطان کەس قسەی بە ئیمامی أبو حنیفة ناووت، ئەوان هیچیان نازانی!؟..

]فیض الباري علی صحیح البخاري له کتێبی العلم

**شوبهەی دووەم: إعتقادی أبو حنیفة رحمه الله:**

»لە تەوحید وە لە ئیثبات صیفات وە ڕەد لەسەر الجهمیة وە لە القدر وە ئیعتقادی لەسەر الصحابة رضي الله عنهم وە هەموو مەسائیلەکانی الإیمانی کبری هاوشیوەیە لەبۆ مەنهەجی سەلەف وە مەنهەجی براکانی ئیمامی مەذاهیبەکان ، چگە لەهەندیك شتی کەم باس کراوە لەسەری ، وەکو ووتنی ئیمان زیادو کەم ناکات ، وە ووتنی لەسەر پێناسەی ئیمان ڕاست کردنە بەدڵ وە ئیقرار کردنە بەزمان ، وە کار کردن دەرچوە لە حەقیقەتی ئیمان.«

ابن_عبد_البر (٣٦٨-٤٦٣ ) و ابن_أبي_العز (٦٣١-٧٩٢ ) باسیان کردوە کە أبو حنیفة گەڕاوەتەوە لەم قسانەشی.«

شیخ_الإسلام رحمه الله (٦٦١-٧٢٨ هـ) دەفەرمووێت:

هەموو زانایان ئیثباتی صیفات الله تعالی دەکەن ، وە دڵێن قورئان کلامی الله مخلوقو دروست کراو نیە ، وە دەڵێن الله دەبیندرێت لە ڕۆژی دوای ، ئەو مەذهبی سەحابەو تابعیەکان لەبوویان بەچاکە وەکو مالك کوڕی أنس وە الثوري وە اللیث

کوڕی سعد وه الأوزاعي وه أبو حنيفة وه الشافعي وه أحمد وه إسحاق...» تەواو بوو...

]منهاج السنة النبوية، (٥٤-٢)[

ئیمامی_الطحاوي لەموقەدمەی دەفەرمووێت (لاپەڕە١):

ئەوە باسی عەقیدەی ئەهلی سوننەتو جەماعەتە لەسەر مەزهەبی فەقیهەکانی ئومەت : « ابو حنيفة النعمان کوڕی ثابت وە ابو یوسف یعقوب کوڕی إبراهيم الأنصاري وە ابو عبد الله محمد کوڕی الحسن الشيباني ڕەزای اللەیان لێبێت أجمعين وە ئیعتقادیان چییە لە ئوسولی دین وە پێ دەگەڕێنەوە بۆ لای رب العالمين ». تەواو بوو.

وە هەروەها دەفەرموێت رحمه الله:

ئەوەی دیارو ڕونە ئەوی باس کراوە لەسەر أبو حنيفة رحمه الله ڕاست نیە ، بەڵکو ڕویداوە لەو کەسانەی کەشوێنی کەوتوون ، چونکە زۆری خراپە أبو حنيفة پێ ڕازی نییە.«

تەواو بوو "شرح العقيدة الطحاوية" (لاپەڕە ٢٢٦).

**شوبهەی_سێیەم : ئایە ڕاستە أبو حنيفة رحمه الله ووتویەتی بەخەلقی قورئان:**

الخطيب البغدادي لە تاريخ بغداد لە ئیمامی أحمد  دەگێڕێتەوە دەفەرمووێت : « لم يصح عندنا أن أبا حنيفة كان يقول بخلق القرآن# « واتە « سابت نییە لەلامان کە أبو حنيفة وتبێتی بە خەلقی قوڕئان.«

**شوبهەی_چوارەم : ئایە ڕاستە حەنفیەکان قیاس دەخەنە پێش حەدیسی پێغەمبەر ﷺ:**

إبن_حزم_الظاهري رحمه الله دەفەرمووێت  : « هەموو هاوەڵانی أبو حنيفة یەك دەنگن لەسەر ئەوەی مەذهەبی ابو حنيفة دەڵێ : حەدیسی زەعیف

ئە ولاترە لەلایان لە قیاس و ڕەئي.«

]مخلص إبطال القياس ا ٦٨.[

**شوبهەی پێنجەم: ئایە ڕاستە أبو حنيفة رحمه الله زەعیفە لە حەدیسوە مەتڕوکە:**

إبن عبد البر رحمه الله لە «جامع بيان العلم» دەفەرمووێت :

»بە إبن المعين ووترا ئەی باوکی زکریا أبو حنيفة ڕاستگویە لە حەدیث؟ فەرمووی: (بەڵێ صەدوقە).

ووتم: یحیی کوڕی معین گەیشتوە بە ئەبو حنیفة وە زۆر باشتر دەیناسێ لە غەیری خۆی...

لە علي کوڕی الحسین لە باوکی دەگێڕێتەوە دەڵێ: « یحیی کوڕی معین ئەگەر باسی کەسێکیان بۆ کردبا قسە بە أبو حنیفة دەڵێ دەیووت:

حسدوا الفتى إذ لم ينالوا سعيه

فالناس أعداء له وخصوم

كضرائر الحسناء قلن لوجهها

حسداً وبغياً إنه لدميم.« ..

مناقب الموفق ا ٩٠-٢

ئیمامی مالیک رحمەالله

برای خۆشەویستم بالەمەجلیسی ئەم جارەماندا بچینە باسێکی تر لە باسی ئیمامێکی بەڕێز ئەستێرەیەکی گەشاوەترئەویش ئیمامی مالک کەلەئاسمانی دیندا هەڵاتون هەتاهەتایە ڕوناکی ئاوا نابێت بچینە خزمەت ئەوکەسەی کەپێغەمبەرﷺ لەبارەی فەرمویەتی زانایەك لەمەدینە پەیدادەبێت عالمی ئیسلامی موحتاجی عیلمی ئەودەبن

بابچینە خزمەتی ئەم زاتە بەڕێزەکەمامۆستای ئیمامی شافعی بوە رحمە اللە بچینە خزمەتی کەتابعی تابعی بوە

ئیمامی مالیك بەقەولێك دەڵێن ساڵی ٩٠ کۆچی لەشاری مەدینە لەدایک بوە لەساڵی ١٩٩ وەفاتی کردوە

ئیمامی مالیك سەرچاوەی عیلم و ئەدەبو خوڕەوشتی بەرزبوە کەوهەرێکی بێ وێنەبوە ڕێزوئەدەبێکی زۆری بۆپێغەمبەر**محمد**ﷺ هەبوە هەرکاتێك ویستبێتی حەدیسی بخوێنێتەوە لەپێشدادەست نوێژی گرتوەخۆی بۆن خۆش کردوە نەی هێشتوەکەس قسەبکات ئینجادەستی کردوە بەحەدیس خوێندنەوە یەکێك لەپیاوچاکان دەڵێت تازەئیمام مالیك خوێندنی تەواوکردبو شەوێك لەخەونمدا پێغەمبەرﷺ لەمزگەوتی مەدینە دانیشتبوو خەڵکێکی زۆر لەخزمەتی دابون ئیمامی مالیکیش لەبەردەمیا ڕاوەستابوزەر فێکیش لەپێش پێغەمبەرﷺ دانرابوو پێغەمبەرﷺ دەستی دەکردەناوزەرفەکەوچنگێك کی پڕی دەردەهێناودەیدایە مالیك ئەویش بەسەر خەڵکدابەشی دەکرد دەفەرموێت لەپاش مدەیەك هەواڵی عیلم دانانی مالیك بەناوخەڵکدابڵاوبویەوە ئەوکاتەزانیم کەمانای خەونەکەم چیە ئیمامی مالیك لە فەرماهیشتێ کیدا ئەفەرموێت بەزانایان وە پێیان ئەڵێت ﴿ئەی زانایانی ئاینی تکاتان لێدەکەم عیلم سوك مەکەن وەخۆتان و ئایەتی قورئان و حەدیثی پێغەمبەرﷺ بێ حورمەت مەکەن ﴾ئایەتوحەدیس بۆیەکێک مەخوێنەوە کە ئیمانی نەبێت ئیطاعەی اللّه وە ڕەسول نەکات ئەی برای زانای ئاینی بزانە کەتۆشو هەموئەو کەسانەش لەدایك بون لەکاتی لەدایک بوندا پشت دەکەنە دنیاو ڕودەکەنە قیامەت چونکە هە تا لە سکی دایکدایت بەرەو دونیادێیت بەڵام کەلەدایك بویت بەرەو قیامەت ئەڕۆیت کاتی مردنت دیاری کراوە پاشوپێش ناکەوێت جابۆیە ئاگات لەخۆت بێت دنیا فریوت نەدات وە لەڕێ لات نەدەن ئیمامی مالیك لەگەڵ

ئەوهەموو عیلم و زانیاریەی و لەگەڵ ئەوەشدا کەنوسینو کتێبەکەی بەناوی مووطای ئیمامی مالیك لەپاش قورئان یەکەم نوسراوە کتێبێکە کەدانراوە بەنرخە زۆر خۆی بە کەم ئەگرتو زۆر ئەمین بوو هەرکاتێك فتوای ئەدا لەدوای نوسینی فتواکەی ئەو ئایەتەی سوورەتی (الجاثیە) دەخوێندەوە کە دەیفەرموو

إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ

]سورەتی الجاثیة:٣٢[

ئێمەهەربەبیروڕای خۆمان ئەو فتوایانە لەئایەت وحەدیس وەردەگرین بەتەواوی لێیان یەقین نیە ئەگەر کەسێك هاتوباشتر تێگەیشتنێکی هەبولەئێمە ئەوا پێیان خۆشە ئیمامی مالیك زۆر ترسی اللهﷻ لەدڵ دابوە بائێمەش چاولەو بکەین دەڵێن: لەمەذهەبی ئیمامی مالیك دا دروست نیە دوای نوێژی عەسر نوێژی سونەت بکرێت کەچی جارێکیان دەبینرێت لەمزگەوت دوای نوێژی عەسر تەشریفی لەمزگەوت دەبێت کوڕێکی گەنج دێت دەڵێت ئەی ئیمامی مالیك هەستەو دوڕکاعەت نوێژبکە ئەویش بەبێ دەنگی هەڵ دەستێت دوڕکاعەت نوێژدەکات دەڵێین قوربان تۆلات وایە کەدوای نوێژی عەسر نوێژی سونەت دروست نیە ؟ ئەی بۆمخالەفەی فتوای خۆتت کرد پاشان ئیمام فەرموی ئاخر لەوەترسام کە اللهﷻ لەوکەسانەم حیساب کات کەپێیان بوترێت هەستن دورکاعەت نوێژ بکەن بڵام نەیکەنو ببرێنە جەهەنم

ئیمامی شەعرانی لەکتێبی الطبقات اکبری دا باسی ئەدەبوشەرموی حەیای ئیمامی مالیك دەفەرموێت لەمەدینەی منەوەرە قەت سواری وڵاخ نەدەبوهەمیشە هەربەپێ خاوسی دەڕۆهیشت دەیفەرمو من شەرم لەاللهﷻ کەبەسواری یا بەپێڵاوەوە بەسەر خاکێکدابڕۆم کەلاشەوجەنازەی موبارەکی پێغەمبەرﷺ لەباوش کردبێت لەگەڵ ئەوەشدا ئیمامی مالیك سامو هەیبەتێکی زۆری هەبوە تەنانەت پاشا و ئەمیرانیش

شەرمیان لێکردوە بچینە سەرچەند باسێك لەگێرانەوەکان کەباس لە ئیحترامی ئیمامی مالیك بۆ عیلم وە زانست چۆن بوە

خەلیفەی بەغداد هارونە ڕەشید دەچێتە مەدینە ی موونەوەرە خەبەر دەزانێت کەئیمامی مالیك کتێبێکی داناوە بۆخەڵکی دەی خوێنێتەوە بەجەعفەری بەرمەکی دەڵێت بچۆبۆلای ئیمامی مالیك وەسەلامی پێ بگەیەنە و بڵێ هارون دەڵێت کتێبەکەی بینی هەندێکیم بۆوەخوێنە جەعفەر  بەرمەکی دەچێت عەرزی دەکات ئیمامی مالیك دەفەرموێت بچۆوەو سلامی من بەخەلیفە بگەیەنە و بڵێ عیلم زیارەتی کەس ناکات دەبێت زیارەتی بکرێت وە پیرکەسەوە ناچێت جەعفەری بەرمەکی چوە عەرزی خەلیفەی کرد لەوکاتەشدا ئیمام أبو یوسوف کە تەلەبەی حەنەفی بو زانایەکی عێراقی زۆر بەرزبولای هارونە ڕەشید دانیشتبو فەرمووی ئەی خەلیفە بەدوایدا بنێرەوە بابێت ئەگینا خەبەر دەچێتەوە بۆعێراق دەڵێن ئیمامی مالیك بەقسەی خەلیفەی نەکردوە لەوکاتە ئیمامی مالیك دێتە ژورەوەو سەلام دەکات وە هارون پێ دەڵێت ئەی ئیمامی مالیك بۆمن دەنێرم بەدواتاجوابم نادەیتەوە ئیمامی مالیك بێ ترس دەڵیت زەیدی کوڕی سابت دەفەرموێت خەریی نوسینی قورئان بوم گەشتمە سەر ئایەتی

لَّا يَسْتَوِى ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُو۟لِى ٱلضَّرَرِ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ(النساء٩٥)

لەوکاتەداعبداللەی کوڕی ام مکتوم لەوێ بووگوتی باشە الله دەفەرموێت ئەوانەی ناچینە غەزاولەماڵەوەن وەك ئەوانەنەنین کەدەچن بۆغەزاپلەوپایەیان فەرقی هەیە؟من کەکوێرم وە غەزام بۆناکرێت چ گوناحێکم لەسەرە؟پێغەمبەرﷺ وتی نازانم زەیدی کوڕی سابت دەفەرمێت منیش قەڵەمەکەم هەڵگرد ڕاوەستام

پێغەمبەرﷺکەمێك بێ هۆش بو لەپاشان فەرموی ئەی زەید بنوسە غَيْرُ أُولِي ٱلضَّرَرِ ئیلائەوانە نەبێت کە عوزرێکیان هەیە . ئیمامی مالیك فەرموی ئەی هارونە ڕەشیدبۆئەودوکەلیمە جوبرەئیل وەپێغەمبەرﷺ ئەوەندەناڕەحەت بون تا الله ﷻ وەحی دابەزاند.

جا من چۆن ڕێزی عیلم نەگرم جەنابیشت الله بەرزی کردویتەوە تۆمەبە بەکەسێك عیلم کەم نرخ کەیت با الله سوکت نەکات هارونە ڕەشید زۆری پێخۆش بو هەستا لەگەڵ ئیمام مالیك ڕۆشت بۆماڵیان فەرمووی لەکتێبەکەت نەختێکم بۆبخوێنە فەرموی زۆر دەمێکە بۆخەڵکم نەخوێندوە هارون فەرمووی باشە باخەڵکەکە بڕواتە دەرێ باخۆم بیخوێنم ئیمامی مالیك فەرموی هەرعیلمێك بۆیەکێك لەخەڵك مەنع بکرێت ئەواکەس سودی لێ ناکات ئینجاعیسای قەزازیان هێنا مووطای ئیمامی مالیك دەخوێندەوەو ئیمامی مالیك مەعنای لێك دەدایەوە هارونەڕەشید گوێ گردبوو پاشان هارونە ڕەشید زۆر بەئەدەبەوە لەئیمامی مالیك ڕوانی

لەپاش ماوەیەک ئیمامی مالیك لەڕۆژی دەیی مانگی رەبیع الأولی {١٧٩} کۆچی لەمەدینەی منەوەرە وەفاتی کرد رحمه الله

ئیمامی شافعی رحمه الله

باسی ژیان و هەنێك لەسەرگوزشتەکانی ئەم ئیمامەبەڕێزەبکەین لەپەڕاوەکانی ئەم جارەماندا تاباشتر شارەزابین لەم ئیمامە پڕعیلمە جێ شانازی ئیمان دارانە

ئیمامی شافعی ناوی محمەدە و کوڕی ئیدریسە و لەعبدالمنافی باپیری پێغەمبەرداﷺ دەبنەوەیەك پشت دایکیشی بەچوارپشت دەچێتەوە سەر خەلیفە عەلی کوڕی ابوطالب ئەم ئیمامە بەڕێزە تەمەنی دوو ساڵان دەبێت باوکی وەفات دەکات دایکی دەیبات بۆمەکە وەپێش دەسپێك کردنی بۆخوێندن دایکی دەیبرد بۆ کۆڕومەجلیسی عولەماکان و خوێندنگاکان ئەوەندە منداڵ بو بابۆڵەی بۆدەکرد تاژیر بێت دەیبرت تاگوێگرێت بەڵکوسۆزو خۆشەویستی عیلم لەدڵیاچەکەرە بکات گەورەبێت ئەم کارەی دایکی شی پربولەبەرەکەت وە سەری گرت ئینجاچوە بەر دەم خوێندو دەستی کرد بەفێر بون لەخزمەت مووسلمی کوڕی خالید کەمفتی شاری مەکە بو لەعومری ١٥صاڵیدا ئەمەندەزیرەک بو ئیجازەی موفتێتی پێدرا ئیمامی شافعی مووطای ئیمامی مالیك لەبەر دەکات بەتەواوی کامل کە نزیکەی ١٥٠٠حەدیسی تیادەچێت بۆمەدینە بۆخزمەت ئیمامی مالیك داوای قسەکردن لەگەڵی دەڵێت بە ئیمامی مالیك ئەی ئیمام هاتومە خزمەتت گوێم لێبگریت کتێبەکەت دەخوێنمەوە بزانە دەی زانم؟ ئیمامی مالیك تەماشەی کرد بەتەمەن منالْ بو فەرموی بچۆلای حەبیبی  کاتب باگوێت لێ بگرێت ئیمامی شافعی فەرموی ئەی ئیمام دوسێ لاپەڕەت بۆدەخوێنمەوە ئەگەر پێت باش نەبودەچم بۆلای ئەو؟ ئیمامی مالیك فەرموی بڵی گوێت لێدەگرم ئیمامی شافعی  هەندێکی بۆخوێندەوە ڕاوەستا ئیمامی مالیك فەرموی دەی بیخوێنە ئیمامی شافعی هەموکتێبەکەی خوێندەوە ئیمامی مالیك زۆری لاسەیربو ئەم کوڕە گەنجە ئاوالەم تەمەنەدا ئاوازیرەکە فەرموی ئەی محمەد ئاگات لەخۆت بێت تۆدەبیە زانایەکی گەورە ماوەیەك لەخزمەت ئیمامی مالیك دا دەمێنێتەوە دواتر دەچێتەوە مکە زیرەکی ئیمامی شافعی بێحەد بوە ڕۆژێک لەخزمەت ئیمامی مالیك دا دەبێت پیاوك دێت بۆ خزمەت ئیمامی مالیك ئیمامی مالیك لەمەدینە

لەشوێن پێغەمبەرﷺ دادەنیشت فتوای ئەدا ئەم پیاوەش پێ ئەڵێت ئیمام من بول بولێکم فرۆشت کەچی ئەمڕۆ بۆی هێناومەتەوە دەڵێ ناخوێنێت منیش تەڵاقم خوارد وتم تەڵاقم کەوتبێت بێدەنگ نابێت هەر دەخوێنێت کابرا گوتی ئایە تەڵاقم کەوتوە ؟ ئیمامی مالیك فەرموی بەڵێ تەڵاقت کەوتوە ئیمامی شافعی گوێ لەباسەکە بو چوەسەر ڕێگای کابراو فەرمووی ئەرێ کاکە بول بولەکەت بەزۆری دەخوێنێت یان بێدەنگ دەبێت کابرا وتی بەزۆری دەخوێنێت پاشان ئیمامی شافعی فەرموی دەبچۆبۆلای ئیمامی مالیك پێ بڵێ کوڕێکی گەنج لەدەرە وە یەو عەڕزت دەکات تەڵاقەکە نەکەوتوە پاشان کابرا چوە لای ئیمام مالیك بۆی گێڕایەوە ئەویش فەرموی ئەو کوڕەم بۆبانگ بکەن پاشان ئیمامی مالیک پێ فەرموو بەڵگەت چیە لەسەری پاشان ئیمامی شافعی دەفەرموێت قوربان جەنابت لەکتێبەکەی خۆتاحەدیسێکت باس کردوە کە فاطمەی کچی قەیس دەچێتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پێیدەڵێت پرسێکت پێ دەکەم موعاوی یەوئەبووجوهەم هەردوکیان هاتونەتەداوام بۆخوازبێنی شووبەکامیان بکەم پێغەمبەرﷺ فەرمووی موعاویە فەقیرە وە ئەبوو جوهەمیش قەت عەساکەی لەسەرشانی دانانێت واتە هەرداریێ کی پێیە قسەکەیت لێت ئەدات پاشان ئیمامی شافعی فەرموی ئەی ئیمامی مالیک ئەم فەرمودەی پێغەمبەرﷺ مانای وانیە کە هەموکات لێدەدات نا کەخەوت لێنادات بەس مەبەست لەوەیە زۆر کات لێ ئەدات ئەوپیاوەش مەبەستی ئەوەبوە کە بەزۆری دەخوێنێت کەواتە تەڵاقەکەی ناکەوێت ئیمامی مالیك قسەکەی وەرگرتو زۆر دەست خۆشی لێ کرد فەرمووی لەمڕۆ وە تۆحەقی ئەوەت هەیە فتوابدەیت ئینجا ئیمامی شافعی دێت بۆبەغداد دوو ساڵ لەبەغداد ئەمێنێتەوە ئیمامی ئەحمەد خەڵک زۆر گویان بۆدەگرت قسەیان لێوەردەگرد بڵام کاتێک مەجلیسی ئیمامی شافعی هەبوایە دەچوگوێ لێ دەگرتوبەقسەی دەکرد دەیزانی سێ هەزار حەدیسی لە بەرە ئیمامی شافعی خەڵک

بەئیمامی ئەحمەدیان دەگود ئەی ئیمام زۆرمان لاسەیرە بەوهەمو عیلمەتەوە دەچیت گویٚ لەگەنجێکی مێرد منداڵ ئەگریت وازت لەم هەمو ڕیش پیٖیو ئوستازە هێناوە ئیمامی ئەحمەد لەوە ڵامیانە دەیگوت ئێوە نای ناسن ونایزانن دەرگای شەریعە داخرا بو الله بەهۆی ئەم گەنجەوە کردیەوە فەرمووی ئێمە لەفظەکەیمان لەبەر کردوە ئەو ماناکەی دەزانێت فەرمووی نەك من هەموو موسوڵمانێك قەرزداری ئیمامی شافعیە ئەبێت دوعای بۆبکەن دەڵێن ڕۆژێک هارونە ڕەشید خەلیفەی بەغداد لەگەڵ خێزانی ئەبێتە شەڕیان خێزانی تورەدەبێت بەهارون دەڵێت تۆجەهە نمیت هارونیش ئەمەی زۆر پێناخۆش دەبێت ئەویش تورەدەبێت دەڵێت ئەگەرمن جەهەنەمی بم تەڵاقت بکەوێت بەوتورەیەوە لەیەك جیادەبنەوە هارونە ڕەشید دەنێرێت بەدوای تەواوی عولەمای بەغداد داوای فەتوایان لێدەکات کەس ناتوانێت پیٚ بڵێت تەڵاقەکەت کەوتوە یان نەکەوتوەچونکە دەڵێن الله دەزانێت ئاخۆهارونە ڕەشید بەهەشتیەیان جەهەنەمیە ئیمامی شافعی لەویادەبێت بڵام لەچاوعولەماکانی ئەویا زۆر کەم تەمەن ئەبێت کەدەزانێت کەس لەخۆی ڕانابینێت وەڵام بداتەوە لەجیٚ گای خۆی هەڵ دەستێت دەڵێت ئەگەر ڕێگام بدەن

من وەڵام ئەدەمەوە زۆربەی ئەوانەی نای ناسن ئەڵێن سەیری ئەو فەقیٚ یە چۆن خۆی شێت کردوە

بەڵام هارونە ڕەشید بانگی کردە لای خۆی گوتی فەرموو فتواکەت بڵیٚ بزانین چی دەڵێت ئیمامی شافعی فەرموی خەلیفە ئایە ئێمە کارمان بەتۆیە یان تۆکارت بەئێمەیە وتی من کارم بەئێوەیە ئینجا ئیمامی شافعی فەرموی کەواتە زەحمەت نەبێت جاریٚ لەسەر کورسیەکەت وەرە خوارەوەچونکە مەرتەبەو پلەو پایەی زاناجاریٚ لەهی

جەنابت بەرزترە هارونەڕەشید هاتەخوارەوە ئەوهەموی زاناوعالمەش واقیان وڕماوە گویان گرتوە تەماشادەکەن ئیمامی شافعی روی کردە هارونەڕەشیدفەرمووی پرسیارێکت لێدەکەم وەڵام بدەرەوە وتی فەرموو ئەی خەلیفە ئەوەتەی تۆبویتە خەلیفە قەت بوە دەسەڵاتت بەسەر تاوان بارێکدابوبێت وە عەفوت کردبێت لەبەر ترسی الله موخالەفەی نەفسی خۆتت کردبێت وتی بەڵێ وەالله چەندجاربولەبەر الله خەڵکم بەخشیوە ئیمامی شافعی فەرموی ئەوا حوکمم کرد کەتۆ بەهەشتیتت وە تەڵاقت نەکەوتوە زاناکان هەریەک لەلایەکەوە بەتوڕەهیەوە وتیان تۆبەچ دەلیلیک ئەم فتوایە ددەیت ئیمامی شافعی زۆر بەهێمنی فەرموی بەڵگەو دەلیلم ئەو ئایەتەی سورەتی النازعات کەالله ﷻ دەفەرموێت

{وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ} [سوڕەتی النازعات:٤٠]

{فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ} [سوڕەتی النازعات:٤١]

هەرکەسێك لەبەر ترسی الله موخالەفەی ئارەزو نەفسی بکات ئەواجێگای بەهەشتە ئەمە فتوای ئەم ئیمامە بەڕێزەبو بە پەیوەستە بەقورئان حوکمی اللّٰه جا هەنێ جاهیل وە کەم عەقڵ دێن قسە بەم ئیمامە بەڕێزانە ئەڵێن ئەڵێن دینیان بۆخەڵک داناوە تەشریعیان کردوە پەنابەالله ئەم ئیمامە بەڕێزە مسقاڵێک لە شەرعی الله لای نەداوە بەڵکوئەوەی وتویەتی کردویەتی پەیوەستبوە بەحوکمی اللّٰه یان فەرماهیشتی ڕەسول الله ﷺ

زۆربەی مەلاکان لەویا دەست خۆشیان لێکرد وە ئافەرینیان لێکرد دوعای خێریان بۆکرد وە هارونەڕەشید بەهاوسەرەکەی شاد بویەوە خەڵاتێکی شی کرد بەڵام ئیمامی

شافعی وەری نەگرت سەفەرێك دەكات  بۆیەمەن لەوكاتەدا كەمامێكی دەبێتە قاضی یەمەن چەند مانگێك لەیەمەن دەمێنێتەوە قەولی قەدیمی  لەعەلامی ئیسلامیدا بڵاودەكاتەوە ئینجا دەچێت بۆمیسرِ لەوێش قەولی جەدیدی بڵاودەبێتەوە ئیمامی شافعی وەك كانێكی ئاڵتون تارۆژی قیامەت سودی بەبەرەی ئیماندارن هەیە وەئیمامی شافعی دەفەرموێت بۆزانایانی ئاینی پەیامێكی هەیە هیج شتێك لە قەناعەتورِازی بون بەدەست كورتی جوانتر نیە دەی فەرمو لەپێش ئەوەدابنە كاربەدەست شەرع فێربن  دواتر فەرمویەتی عیلم ئەوەنیە لەبەری كەیت عیلم ئەوەیە كاری پێبكەیت دەڵێن ئیمامی شافعی واپیرنەبو كە گۆچان بەدەست بگرێت بەڵام هە مو كات گۆچانی بەدەستە بۆ دای نەدەنا پێیان وت ئیمام الحمدالله واپیرنیت كە گۆچانت هە موكات  پێیە دەفەرموێت بۆئەوەی هەمیشە واهەست بكەم كەلەدنیادا رِێبوارم پاشان دەیفەرموو كارێك مەكەن كەم نرختان كات ئەی فەرموو ئاوی سارد گەرزەرەری ببوایە بۆپیاوەتی قەت نەم دەخواردەوە

دەم كوت كردنی موعتەزیلەكان لەلایەن ئیمامی شافعی

موعتەزیلە تاقمێكی گومرِان سەرلێشێواون ئەیان وت قورئان مەخلوقە و كلا می الله نیە جائیمامی شافعی مناقەشەیان دەكات وە بەبەڵگەی ئایەت و حەدیس دەم كوتیان ئەكات مەجموعەیەك لەقسەزانەكانیان ئەچنە خزمەتی بۆموناقەشە وەدەڵێن گەورەترین درۆبەدەم الله كەهەڵ دەبەسرێت یەك سان كردنە بەدروست كراوەكانی وە چەسپاندی چەند صیفاتێكی وەك بیستن، بینین، دەست، قاچ وە ئەمەش شوبهاندی بە الله بەدروست كراوەكانی لەكاتێكدا لەقورئان داهاتوە ئەفەرموێت {لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ} [سورەتی الشوری:١١]

)واتاهیچ دورست کراوێک وەکو اللّٰه نیە(

وەدواتر گەورەترین درۆ کەبەدەم الله دەکرێت ئەوەیە کەدەڵێن قورئان مەخلوق نیە وەکلامی الله بەمەش وادائەنێن کە الله قسەئەکات وەك چۆن خەڵك قسەئەکات ئەمەش شوبهاندنی الله بەدروست کراوەکانی، لەکاتێکدا لەقورئان دا هاتوە

إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ

]سورەتی الزخرف:٣[

وشەی (جعل) بەمانای خلق دێت دروست کردن وەهەر لەقورئان داهاتوە کە الله دەفەرموێت الله دروست کاری هەموشتێکە وەقورئان یش مەخلوقێکە دروستی کردوە بۆئەم شتانە وەڵامت چیە ئەی شافعی؟

جابزانین ئیمامە پڕعیلمەکە چۆن بەعیلم وئەدەب جوابیان ئەداتەوە بەبەڵگەی ئایەت و حەدیس دەم کوتیان ئەکات

ئیمام پاش سوپاس وستایشی الله دەفەرموێت سەرەتاشوبهاندنی الله بەدروست کراوەکانی ئەمە شتێکە موسوڵمان شتی وابڵاوناکاتەوە وەبەڵگەکەت بۆئەم ئایەتە کە

الله ئەفەرموێت (لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ)ئەوە بەڵگەیەكی ناتەواوە ناقصەئەگەرئەو ئایەتەتەواوبكەیت بۆت دەردەكەوێت كە الله ﷻ ئەفەرموێت

لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِير

]سورەتی الشوری:١١[

اللهﷻ سیفاتی بیستن وە بینین بۆ خۆی دائەنێت لەكاتێكدا ئێوە ئەڵێن الله نابیستێت وەنابینێت ئایە كێ درۆی بۆ اللهﷻ هەڵ بەستوە؟پاشان یەكێك لەموعتەزیلەگومڕاكان ئەڵێن دانانی صفاتی بیست وە بینن بۆ الله ئەوە شوبهاندنەوە پێچەوانەی عەقڵیشە بەدڵنیایە وە ئەمە جێ گومانەلامان

پاشان ئیمامی شافعی پیان ئەفەرموێت كێ لە عولەما یانو زانایان فەرمویان اللهﷻ قسەكات هەروەك چۆن ئێمەقسەكەین یان ئەبینێت هەروەك چۆن ئێمە ئەبینین ئێمە ئەڵێن اللهﷻ قسەكات كەی بیەوێت وەهیج شتێك هاوشێوەی اللهﷻ نیە ئێمە نازانین چۆن قسەئەكات وە لەبارەی ئەو ئایەتەش

إِنَّا جَعَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيّٗا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُون

]سورەتی الزخرف:٣[

ئەوانە ئەو قسەیە ی كەدەڵێت جعل بەمانای خلق دێت ئەوە ڕەد ئەكرێتەوە هەربەنەصی قورئان خۆی چونكە جعل بەمانای دروست كردن گێڕانیش دێت

هەروەها الله لەبارەی قەومی أیبراهیم ئەفەرموێت(جائەوان نیازی خراپیان بە أیبراهیم كردو ویستیان بیسوتێنن جائێمەش گێرامانن لەدەستەی ڕیسوایان گومڕایان)واتاگێران لەڕسوایانو ژێركەوتوان ئاشكرایە ئەوان دروست نەكران بەهوی كارەكەیانەوە گێردران وەلەسەر ئەم وتەی الله كەدەفەرموێت

إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا

واتابەزمانی عەرەبی ئەم قورئانە مان دانا

پاشان موعتەزیلەکان ئایەتێکی تریان هێنا و وتیان  ئەی ئەمەیانچی

إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ

]سوڕەتی الأنعام:١٠٢[

اللهدروست کاری هەموشتێکە وە قورئان نیش یەکێکە لەوشتانە کەواتە قورئان مەخلوقە

پاشان ئیمامی شافعی فەرموی الله ئەفەرموێت

قُلْ أَىُّ شَىْءٍ أَكْبَرُ شَهَٰدَةً قُلِ ٱللَّهُ شَهِيدٌۢ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ

{قل الله شهيد بيني وبينكم} بڵێ: الله کە لەهەموو شایەتێك گەورەترو بەئاگاترە لە نێوانماندا شایەتە

]سوڕەتی الأنعام:١٩[

الله وەسفی نەفسی خۆی کردوە بەوەی کەشتێکە ئایە ئەمە واتای ئەوەیە کەالله دروست کراوە  مەخلوقە کەواتە لەسەر ئەم بنەمایە وتەکەی خرایە پەروەردگار وەئەمە ئەوەناگەیەنێت الله مەخلوق بێت وەک چۆن لەئایەتێکی تردا اللّٰه ئەفەرموێت هەمونەفسێك ئەبێت بمرێت ئێ ئەم ئایەتە مانای ئەوەنیە کە الله ش ئەبێت بمرێت بەڵام ڕاستی مەبەست لەوەیە کە نەفسە دروست کراوەکان مردنیان

بەسەردادێت نەجات بونیان نیە بەڵام نەفی اللە ﷻ نامرێت قەت بەم جۆرە ئەوەی لەمەجلیسەکەدابو قسەیان پێنەماو بەبەڵگەی ئایەت هەمویان دەم بەست کرد بۆیە بۆمان دەرکەوت کە قسەوتن بەم ئیمامە بەڕێزە جگە لە گەمژە ی و بیَ عەقڵی هیچی ترنیە.

## ئیمامی ئەحمەدکوری حەنبەل {رحمە اللە}

ئیمامیکی درەوشاوەی ئومەتی ئیسلامی ئیمامی ئەحمەدە کە شەهیدی قورئان بوە جابا بچینە خزمەت باسو ژیانوبەسەرهاتی ئەم چرا پرشنگ دارە

ئیمامی ئەحمەدی کوڕی محەمەدی کوڕی حانبەلە لەشاری بەغداد لەدایك بوە چوارەم پێشەواو سەرمەزهەب بوە ئیمامی ئەحمەد تاکۆمەڵی موعتەزیلە لەشاری بەغدا سەریان هەڵ نەدا لای هەموو دانا و زانا تەواوی موسوڵمانان زۆر خۆشەویست بو ئیمان و تەقواوی ئیمامی ئەحمەد وەك موعجیزە ئە بو ئیمامی ئەحمەد زۆر دەچوە مەجلیسی ئیمامی شافعی هەرچەندە لەتەمەندا ئەو لە ئیمامی شافعی گەورەتر بو بەخزمەت زۆر لەپیاوە عالمەکان گەیشتبون وەک (زوالنون)ی میسری و (بشیری حافی)و(سەری سەقەتی)وشێخ مەعروفی کەرخی ئەو عولەمابەڕێزانە زۆریان خۆش ویستوە بەشیری حافی اللە لێی ڕازیبێت کەباسی ئیمامی ئەحمەدیان لادەکرد دەیفەرموو ئەی خەڵیکینا ئێوە نازانن ئیمامی ئەحمەد سێ صیفات وخەسڵەتی تێدایە یەکێک لەو سێ خەسڵەتە لەمندانین وتی یەکەم ئیمامی ئەحمەد هەوڵ ئەدات هەموکات بۆخۆی ماڵو منداڵی شتی حەڵاڵ پەیدا بکات بڵام من هەر هەوڵی حەڵاڵ بۆخۆم ئەدەم فەرمووی دوەم خەسڵەتیان ئەوەیە هەرچی

بدەنێ وەری ناگرێت وەسێ یەم ئەوەیەکە ئەو نەچوە بۆلای زۆر کەس هەروە ها ئیمامی شافعی کەتەشریفی لەبەغداد چوە بۆ میسر پرسیاریان لێکردوە کەزاناو زاهیدی بەغداکێیە ئەویش لەوەڵامدائەو جوملەی فەرموە کاتێ من بەغدادم جێ هێشت لە ئیمام ئەحمەد زاناترو ڕاعی ترم جێ نەهێشتوە دەڵێن ئیمام ئەحمەد دوعای زۆرزو گیرابوە دەڵێن کوڕێکی گەنج دایکی زۆرنەخۆش بوە ڕۆژێك بەکوڕەکەی دەڵێت ڕۆڵە ئەڵێن ئیمام ئەحمەد دوعای زۆر گیرایە دەبێ هەستە بچۆ بۆلای بادوعایەکم بۆبکات کوڕەکە دێتوعەرزی ئیمام دەکات ئەویش دەڵێت جامن چیم تا شالله دوعام گیراکات دەفەرموێت بەڵام لەالله دەپاڕێمەوە شفای بدات کاتێك کوڕەکە ئەچێتەوە بۆمالەوە دایکی چاك بۆتەوە

عەرزیان کرد ئەی ئیمام کۆمەڵێك لەمەلاو فەقیە لەمزگەوت دادەنیشن عیلمیان بەوە نیە کەئینسان دەبێت هەوڵ بدات فەرموی ئەوەی دەڵێت ئەوانە بێ عیلمن غەڵەت دەکات ئەوەعیلمیان لەمزگەوتی داناون وتیان جاچۆن دەبێت قوربان هیمەتی ئەوجۆرەکەسانە دەبێ هەر پاروە نانێك بێت وتی جاچ هیمەتێك لەهیمەتی ئەوکەسە بەرزترە هەیە کە بە پاروە نانێك قەناعەت بکات ئیمامی ئەحمەد زۆر زاناو دانا بو کاتێك کۆمەڵی موعتە زیلە پەیدابون دەستیان کرد بەدوژمنایەتی کردنی ئیمام وە لای خەلیفەی بەغداد شکاتیان لێکرد گوتیان ئیمامی ئەحمەد لای وایە اللّٰه قسەدەکات دەڵێت قورئان مەخلوق نیە خەلیفەش توڕەبو گوتی چۆن بچن بۆم بانگ بکەن چون ئیمام ئەحمەد یان گرتو بردیان بۆ بەردەم خەلیفە لەدەرگای بارەگاکە کە دەیان برد بۆلای خەلیفە کابرایەك بینی چوبۆلای وتی ئیمامی ئەحمەد من کاتی خۆی لەسەر دزی هەزار داریان لێداوم ڕاستیم نەگوت تۆش ئاگات لەخۆت بێت بەهۆی لێدان وە ئەزیەت دانەوە لەحەق لانەدەیت بردیان بۆلای خەلیفە وتی تۆبەچ دەلیلێك دەڵێت قورئان غەیرە مەخلوقە ئیمامی ئەحمەد فەرموی پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی الله

قسەی لەگەڵ حەزرەتی موسا داکردوە خەلیفە وتی پێغەمبەر قەت وای نەوتوە ئیمامی ئەحمەد فەرموی ئەگەر ئەو حەدیسە وانەبێت خۆ ئەم ئایەتە ڕاستە لەبەرچاوە کەدەفەرموێت {وَلَٰكِنْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ مِنِّى لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ} [سورەتی السجدة:١٣]

فەرموی ئەگەر ئەوە کلامی الله نەبێت مانای وایە مەخلوقەو یەکێك وتویەتی ئەگەریش کەسێك وتبێتی مانای وایە قسەی زۆر لەخۆی زیادی گوتوە چونکە الله نەبێت کێ دەتوانێت مرۆڤ و پەری جن بەرێت بۆجەهەنم پڕبکات دەڵێن دوونەفەر لەزانا موعتەزیلەکان لەویابون وتیان قوربان بیکوژە ئۆباڵی بەمل ئێمە خەلیفە وتی بیبەن دارکاری بکەنو بیبەنە حەپس خانە گرتیان زۆرلێیان دا تاخەلیفە المعتصم مرد لەپاش ئەو هارون الواثق بوو بەخەلیفە لەزەمای هاروند زۆریان لێدەداو زۆریان ئازارئەدا ڕۆژێك پاسەوانی سجنەکە دەچێت بۆلای فەرموی ئەی ئیمامی ئەحمەد ئەوحەدیسەی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت زاڵم ئەوانەشی یارمەتی زاڵم ئەدەن دەچنە جەهەنم فەرموی بەڵێ وایە وتی جامن یارمەتی زاڵم ئەدەم کەواتە ئەچمە جەهەنم ئیمام فەرمووی وانیە ئەوکەسە یارمەتی زاڵم ئەدات کەنانت بۆحازر ئەکات وەچێشتت بۆلێ ئەنێت وە خزمەتت ئەکات تۆ بۆخۆت زاڵمی مەبەستی خێزانی بو

ئیمامی ئەحمەد لەبەندین خانەمایەوە تا الواثق مردوو بو بەدەوری جەعفەری ماوەیەك لەبەندین خانە هێنایانە دەرێ زۆری دڵ نەوای کرد بڵام ئەوەندەیان ئەزێت دابو هەموو گیانی برین بو هەربەو برین ونەخۆشیەوە وەفاتی فەرموو ئیمامی أحمد زۆر حەق بێژ بو زۆر ڕاست گۆ بو دەڵین پیاو چاکێك دەڵێت من ماڵم لە

قەزوین بو جیران و دراوسێیەکمان کوژرا ئەوشەوە ئیمامی؟ ئەحمەد تیایدا شەهید کرابو بەیانی برای ئەو دراوسێیەمان هات بۆلام وتی ئەم شەو خەوێکی سەیرم بینی براکەمم بینی بەسواری زۆر دڵ خۆش بو وتم تۆشەهید نەکراویت بو دڵ خۆشیت وتی باشەهید کرام بەڵام ئەم شەو ئیمامی ئەحمەد لەبەغداد وەفاتی فەرموو الله ﷻ فەرمووی کەتەوای شوهەداء دانیشتوانی ئاسمان حازری جەنازەی ئیمام أحمد بن.